# چەند نەگۆڕێك لەسەر ڕێبازی جیهاد دا ؛

- ئەڵقەی دووەم —

-شێخ یوسف العییري؛ ڕەحمەتی خوای لێبێ

## نەگۆڕی دووەم

## جیهاد پەیوەست بە کەسێکەوە نییە

ئەوەی لەمڕۆدا سەیری ئوممەتی ئیسلام بکات؛ دەبینێ - ئەگەر بە قسەش نەبێ - بە زمانی حاڵەوە جیهاد بە کەس وتاك وخەڵکێکی دیاریکراوەوە دەبەستنەوە. لەوانەشە زۆرێك لە موسوڵمانان پێت بڵێن: دینەکە دینی خوایەو ئەگەر خزمەتکەرانی ئەو دینە مردن ونەمان خوای گەورە خزمەتکەری لە لایەن خۆیەوە بۆ دروستدەکا بیپارێزن، بەڵام کە دێینە سەر هێنانە جێی ئەو چەمکە لە واقیعدا دەبینین کە هێشتا نەگەیشتووینەتە هەنگاوی ئەنجامدانی ئەو پەیڕەوە لە ژیانمان. ئەوەی ئەمڕۆ - لە ڕێی ئەدەبیاتو گوتارەکانەوە - سەیری حاڵی ئوممەتی ئیسلام بکات؛ دەبینێ کە چینێکی بەرچاوی خەڵك ڕووداوەکان بە خەڵکانێکی تایبەتەوە دەبەستنەوەو، نەك تەنها لەسەر ئاستی جیهاد؛ بەڵکو ئەو حاڵەتە باڵی بەسەر بواری بانگەواز وچاکخوازی وئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپەو لایەنی تریشدا کێشاوە.

ئەوەی لەم ئەڵقەیەدا بۆ ئێمە گرنگ بێ دوویاتیکەینەوە کە جیهاد کردن نە بە سەرکردەو نە بەتاکەکانەوە بەستەو، بەستنەوەی جیهاد بە کەسانێکی تایبەتەوە - چ سەرکردە بن

وچ موجاهید - دەردێکی سەختە کە جێگیربوونی جیهاد لە لای موسوڵمانان تووشی لەرزە دەکات‌و، هەر وەك بەستنەوەی جیهادیش بە خەڵکێکی دیاریکراوەوە بڕواو قەناعەتی بەردەوام بوونی جیهاد وگونجانی بۆ هەر سەردەمێك لاواز دەکات .. بەڵکو وەك گرنگترین بەربەستی دەروونی ومەنهەجی لێدێ بەرامبەر بە هەر کەسێك بیەوێت ڕێگەی جیهاد بگرێت وخۆی بۆ ئەو عیبادەتە مەزنە یەکلاکاتەوە.

خوای پەروەردگار هاوەڵانی پەیامبەری لەسەر ئەوە پەروەردە کردبوو کە خۆیان تەنها بە خۆی وبە دینەکەیەوە پەیوەستکەن‌و، ئەوەی بۆ ڕوون کردبوونەوە کە خۆبەستنەوە بە خەڵکانێکی تایبەتەوە پەیڕەو ومەنهەجێکی گومڕایە کە وا لە مرۆڤ دەکات کار وکردار بەو کەسانە پەیوەستکات‌و، لەوانەیە هەر بە کۆتایی هاتنی ژیانی ئەو کەسانەوە کار وکردارەکەش کۆتایی پێ بێت. کە خوای پەروەردگاریش نەهی لە هاوەڵانی پەیامبەر کردبوو خۆیان بە خەڵکانێکی تایبەت ببەستنەوە نەهیەکە لەوە نەبوو خۆیان بە کەسانێکی وەك خۆیانەوە پەیوەستکەن، نەخێر؛ بەڵکو نەهیەکە لەوەبوو عیبادەت وپەرستنی خوای پەروەردگار بە شەرەفمەندترین خەڵقی خوای پەروەردگارەوە ببەستنەوە کە محمدی کوڕی عبداللە یە - صلی اللە علیە وسلم - ! خوای پەروەردگار نەهی لەوە لێکردبوون خۆیان بە کەسی پەیامبەرەوە ببەستنەوە - صلی اللە علیە وسلم - کە دەفەرموێت؛ {وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ ۚ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا ۗ وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ} - محمد صلی اللە علیە وسلم؛ تاکە پێغەمبەرێك نەبووە وەفات بکات، بێگومان پێغەمبەرانی پێش ئەمیش (وەفاتیان کردووە)، ئایا ئەگەر وەفاتی کرد یان کوژراو شەهید بوو، ئێوە پاشگەز دەبنەوە و هەڵدەگەڕێنەوە ؟! (لەو دین و ئاینەی کە پێی ڕاگەیاندوون) خۆ ئەوەی هەڵگەڕێتەوە و پاشگەزبێتەوە، ئەوە هەرگیز زیان بەخوا ناگەیەنێت، لە داهاتویەکی نزیکدا خوای گەورە پاداشتی سوپاسگوزاران دەداتەوە - ئەم ئایەتە بۆ ئەوە دابەزی کە هاوەڵانی پەیامبەر پەروەردەکات ولەو پەیڕەوە گومڕایەیان ئاگادارکاتەوە کە دەبێتە هۆی فاسد کردنی عیبادەت وپەرستش؛ کە بەستنەوەی کار وکردارە بە کەسەکان. مەبەستیش لەو پەیوەستکردنی کار وکردار بە کەسەوە دانانیان نییە بە

هاوەڵ وشەریك لەگەڵ خوای پەروەردگار، کە جار وایە شیرکی بچووك وجار وایە شیرکی گەورەیە، بەڵکو مەبەستمان لە بەستنەوەی کردار بە کەسەوە ئەوەیە کە مرۆڤی موسوڵمان وا بزانێ ئەو عیبادەتە - وبە تایبەتی جیهاد - تەنها بەو هۆکارە پێشکەوتووە وسەرکەوتوو بووە وشتێکی بەدەست هێناوە چونکە خوای پەروەردگار فلان وفیساری لە پێشەنگی خزمەتکەرانی ئەو عیبادەتە داناوە، ئەمەش وەك وێنە بچووکترین دیمەنی ئەو نەهیەی خوای پەروەردگارە لەو مەنهەج وپەیڕەوەو، خوای پەروەردگاریش نەهی لە هاوەڵانی پەیامبەر کردبوو - صلی الله علیه وسلم - لەسەر ئەو پەیڕەوە بن. قسەی ئەهلی تەفسیریش دەربارەی ئەو ئایەتە مەبەستی قسەکانی پێشوومان ڕووندەکەنەوەو، مەترسی ئەو پەیڕەوەش ڕۆشن دەکەنەوە کە بێگومان مرۆڤ بە واز هێنان لە دین ویاخود بە لاوازکردنی خزمەتی مرۆڤ وکارکردنی بۆ ئەو دینە دەگەینێت.

ابن کثیر لە تەفسیری ئایەتی پێشوودا (٤١٠/١) دەفەرموێت: (کاتێك کە خەڵکێك لە موسوڵمانان لە ڕۆژی ئوحود دا شکان وخەڵکێکی تریان لێ کوژرا؛ شەیتان هاواری کرد کە محمد کوژراوەو، "ابن قمیئة" گەڕایەوە لای موشریکان وگوتی محمدم کوشت، لە ڕاستیشدا نەیکوشتبوو بەڵکو سەری بریندار کردبوو، بۆیە خەڵکێکی زۆر ئەوەیان لە دڵدا نیشت وگەیشتنە ئەو بڕوایەی کە پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - کوژراوەو، هەر وەك چۆن خوای پەروەردگار باسی زۆرێك لە پەیامبەرانی پێشوو دەکات ئەگەریان هەبوو کە واش بەسەر پێغەمبەردا بێت، هەر بۆیەش لاوازی ڕووی تێکردن ولە شەڕەکە دواکەوتن‌و، ئا لەوەدا خوای پەروەردگار ئەو ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێت: {وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُل} - محمد صلی الله علیه وسلم؛ تاکە پێغەمبەرێك نەبووە وەفات بکات، بێگومان پێغەمبەرانی پێش ئەمیش (وەفاتیان کردووە) - واتە پەیامبەرانە نموونەن لە پەیام ولە ئەگەری کوژرانیاندا).

"ابن أبی نجیح" لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە کە یەکێك لە موهاجیران بەسەر کابرایەکی ئەنساردا تێدەپەڕێ خەڵتانی خوێنی بووەو ودەفەرمێ: فلان؛ هەستت بەوە کرد کە محمد - صلی الله علیه وسلم - کوژراوە ؟ ئەنسارییەکە دەفەرمێ: ئەگەر محمد کوژرابێ ئەوە پەیامەکەی خۆی گەیاند، ئیتر شەڕ لەسەر ئەو دینەتان بکەن، بۆیە خوای پەروەردگار ئەو ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێت: {وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُل}حافظ ئەبو بەکری بەیهەقی لە "دلائل النبوة" دا باسی دەکات.

دواتر خوای پەروەردگار ئینکار لەسەر ئەو کەسانە دەکا کە لاوازییان تێکەوتبوو ودەفەرموێت: {أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ} - ئایا ئەگەر وەفاتی کرد یان کوژراو شەهید بوو، ئێوە پاشگەز دەبنەوە و هەڵدەگەڕێنەوە ؟! - {وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا ۗ وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ} - خۆ ئەوەی هەڵگەڕێتەوە و پاشگەزبێتەوە، ئەوە هەرگیز زیان بەخوا ناگەیەنێت، لە داهاتویەکی نزیکدا خوای گەورە پاداشتی سوپاسگوزاران دەداتەوە - واتە ئەو کەسانەی لە گوێڕایەلی ئەودا بوون وشەڕیان لەسەر دینەکەی کرد وبە زیندوویی ومردوویی شوێن پەیامبەرەکەی کەوتن.

هەمان ئەوەش لە کتێبە صەحیح وموسنەد وسونەنەکانداو لە کتێبەکانی تری ئیسلام لە چەندین ڕێی جۆراوجۆرەوە دووپات کراوەتەوە کە بە تێکرایان مانای دروستی ودڵنیایی دەگەینن، هەروەها لە موسنەدی ئەبو بەکر وعومەردا ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێ ئەوەم خستۆتە ڕوو کە ئەبو بەکری صدیق ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ ئەو ئایەتەی لە کاتی مردنی پێغەمبەردا - صلی الله علیه وسلم – خوێندەوە .. ئیمامی بوخاری دەگێڕێتەوە کە عائیشە ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ دەفەرمێ: ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێبێ بە سوارێك لە ماڵی خۆیەوە لە "سنح"ەوە بەڕێکەوت تا لە مزگەوتی پەیامبەردا دابەزی وبێ ئەوەی هیچ قسەیەك لەگەڵ خەڵکدا بکات چووە لای عائیشەو ڕووی کردە پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - کە بە کراسێکەوە داپۆشرابوو، لە بەر چاوی لایبرد وکەوتە سەری وماچی

کرد وگریاو پاشان گوتی؛ دایك وباوکم به فیدات بن، قەسەم به خوا؛ پەروەردگار دوو مردنت بەسەردا کۆناکاتەوە، هەرچی ئەو مردنەی لەسەرت نووسرابوو ئەوە خستتە پێش.

ئیمامی زوهری دەفەرمێ؛ ئەبو سەلەمە لە ابن عباسەوە بۆی گێڕامەوە کە: عومەر - ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ - خەریك بوو قسەی بۆ خەڵك دەکرد کە ئەبو بەکر - ڕەزای خوای لێبێ - هات وگوتی دانیشە ئەی عومەر، پاشان ئەبو بەکر فەرمووی: "لە دوادا؛ هەر کەسێك پەرستن وعیبادەتی بۆ محمد بوو ئەوە محمد مرد ! ئەوەی خوایشی دەپەرست ئەوە خوا زیندووە وقەت نامرێ، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُل – تا ئەو شوێنەی دەفەرموێت – وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ} "، دەفەرمێ قەسەم به خوا وەك ئەوەی خەڵك تازە زانیبێتیان خوای پەروەردگار ئەو ئایەتەی دابەزاندووە کاتێك کە ئەبو بەکر - ڕەزای خوای لێبێ - خوێندییەوەو، ئیتر خەڵك لە ئەبو بەکریان وەرگرت وهەر کەسێك دەمبیست ئەو ئایەتەی دەخوێندەوە. سەعیدی کوڕی موسەییب - ڕەحمەتی خوای لێبێ - پێی گوتم کە عومەر - ڕەزای خوای لێبێ - فەرمووبووی: قەسەم به خوا هەر ئەوەندە بوو گوێم لە ئەبو بەکر بوو خوێندییەوە، ئارەقەم کرد وقاچم ئیتر هەڵیان نەدەگرتم وکەوتمە سەر زەوی.

أبو القاسم الطبرانی لە ابن عباسەوە دەگێڕێتەوە کە عەلی - ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ - لە ژیانی پەیامبەردا - صلی الله علیه وسلم - دەیفەرموو: {أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ} - ئایا ئەگەر وەفاتی کرد یان کوژراو شەهید بوو، ئێوە پاشگەز دەبنەوە و هەڵدەگەڕێنەوە ؟! - کە خوای پەروەردگار هیدایەتی داوین وڕێنموونی کردووین قەسەم به خوا جارێکی دی هەڵناگەڕێینەوە، گەر بمرێتو یا بکوژرێ قەسەم به خوا تا دەمرم شەڕی لەسەر دەکەم، قەسەم به خوا من برا وهاوەڵ وئامۆزاو میراتگیرم، دەی کێ لەمن لەو نزیکترە ومافی بەسەرییەوە زیاترە.

هەروەها كە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ كِتَابًا مُّؤَجَّلًا} - هیچ كەسێكیش نامرێت مەگەر بەویستی خوا نەبێت، كە لە كات و وەختی دیاری كراودا نووسیویەتی - واتە هیچ كەس بێ لە قەدەری خوای پەروەردگار وتا ئەو كاتەی بەو ئەجەل وماوەیە دەگات كە خوای پەروەردگار بۆی دیاری كردووە نامرێت‌و، هەر بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {كِتَابًا مُّؤَجَّلًا} - لە كات و وەختی دیاری كراودا نووسیویەتی - وەك لە شوێنێكی دی دا دەفەرموێ: {وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِ إِلَّا فِي كِتَابٍ} - هیچ تەمەن درێژێك، تەمەنی درێژ نابێت و لە تەمەنی كەم نابێتەوە، بێ ئەوەی لە زانستی خوادا یاداشت نەكرابێت - ودەفەرموێت: {هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ثُمَّ قَضَىٰ أَجَلًا ۖ وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُ ۖ} - خوا ئەو زاتەیە كە ئێوەی لە قوڕێك دروست كردووەو لەوەودوا كاتێكی بڕیاردا (كە بڕێك لە زانایان بە كاتی ژیانی دونیا تا مەرگی تەفسیر دەكەن‌و ئیمامی طَبَري لە تەفسیرەكەیدا هەڵیدەبژێرێ) و كاتێكی دیاریكراوی تریشی لای خۆی بڕیارداوە (كە بڕێك لە زانایان بە كاتی زیندوو بوونەوەی تەفسیر دەكەن) - ئا لەم ئایەتەشدا خوای پەروەردگار ورەی ترسنۆكان بەرزدەكاتەوەو هانیان بەرەو شەڕ وجەنگەوە دەدات، چونكە پێشڕەوی وپاشەكشە لە شەڕدا نە هیچ لە تەمەنی مرۆڤ كەم دەكاتەوەو نە هیچیشی لێ زیاد دەكات، هەروەك "ابن أبی حاتم" لە "حبیب بن صهبان"ەوە دەگێڕێتەوە كە: یەكێك لە موسوڵمانان - ئەویش "حجر بن عدی"یە — دەفەرمێ (واتە بە موسوڵمانان)؛ چ شتێك ڕێی لێ گرتوون لەو خاڵە بپەڕنەوە بەرەو ئەو دوژمنانە - مەبەستی ڕووباری دیجلەیە - {وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ كِتَابًا مُّؤَجَّلًا} - هیچ كەسێكیش نامرێت مەگەر بەویستی خوا نەبێت، لە كات و وەختی دیاری كراودا - پاشان بە سوارەكەیوە خۆی بە دیجلەدا داو ئیتر كە پێشكەوت خەڵكەكەش بە دوایدا چوون‌و، كە دوژمن ئەوەیانی لێ بینی وتیان: دێوان - یانی جن بە فارسی - وهەڵاتن".

* وبە گشتی هەر دوو ئەجەلەكە لێكدانەوەی جیاوازیان بۆ كراوە لە لایەن زانایان كە لە كتێبەكانی تەفسیردا خراونەتە ڕوو. دەتوانی چاو بە تەفسیری ئەم ئایەتە لە تەفسیری ئیمامی طَبَري دا بگێڕیتەوە.

نووسەری "زاد المسير" لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرمێ: (کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ} - محمد هەر تەنها پەیامبەرێکە - ابن عباس دەگێڕێتەوە کە؛ لە ڕۆژی ئوحود دا شەیتان هاواری کرد وگوتی محمد مرد، بۆیە خەڵکێك وتیان: ئەگەر کوژرابێ دەی با دەست بخەینەوە دەستیان خۆ ئەوان هەر کەسوکار وبرای خۆمانن و ئەگەر محمدیش زیندوو با خۆ نەدەشکاین، بۆیە خوای پەروەردگار ئەو ئایەتەی دابەزاند. "ضحاك" - ڕەحمەتی خوای لێبێ - دەفەرموێ: برێك لە مونافیقان گوتیان؛ ئەوە محمد کوژرا دەی کەواتە بگەڕێنەوە سەر دینەکەی پێشووتان، بۆیە خوای گەورە ئەو ئایەتەی هێنایە خوار. هەروەها "قتادة" - ڕەحمەتی خوای لێبێ دەفەرموێ: خەڵکێك وتیان؛ گەر پەیامبەر با نەدەکوژرا).

نووسەری فتح القدير (١/٣٨٥) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرمێ: (کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُل} - محمد (صلى الله عليه وسلم) تەنها پێغەمبەرێك نەبووە وەفات بکات، بێگومان پێغەمبەرانی پێش ئەمیش (وەفاتیان کردووە) -، هۆکاری دابەزینی ئەوەیە کە؛ پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - لە ڕۆژی ئوحود دا بریندار بوو، شەیتان هاواری کرد وگوتی: ئەوە محمد کوژرا، بۆیە برێك لە موسوڵمانان شکستیان هێناو ڕووخان، تا ئەو ڕادەی یەکێکیان گوتی: ئەوە محمد لێی درا، دەی دەست بخەنەوە نێو دەستیان خۆ ئەوان هەر براتانن ! یەکێکی تر گوتی: خۆ ئەگەر پەیامبەر با نەدەکوژرا، بۆیە خوای پەوەردگار ڕەتی دانەوەو ئەوەی پێ ڕاگەیاندن کە - محمد - پەیامبەرێکەو پەیامبەری تریشی لە پێشدا هاتوون ورۆشتوون وئەویش هەر وەك ئەوان دەڕواو، بۆیە ئەو ڕستەیەی دەفەرموێت: {قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُل} - بێگومان پێغەمبەرانی پێش ئەمیش (وەفاتیان کردووە) - سیفەتی پەیامبەرە، وەك ئەوەی خەڵکەکە مردنی ئەویان بە دوور دەزانی ودوو سیفەتیان نابووە پاڵ پێغەمبەرەوە کە سیفەتی پەیامبەرێتی ونەمری بوون، بۆیە خوای پەروەردگار ڕەتی دانەوەو ئەوەی بۆ دووپات کردنەوە کە محمد هەر پەیامبەرەو سیفەتی نەمرێتی نییە، لە خوێندنەوەی ابن عباس دا

دەیخوێندەوە: {قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ رُسُل} - بێگومان پەیامبەرهایەك پێش ئەمیش (وەفاتیان کردووە) - پاشان خوای پەروەردگار ئەوەی لێ ئینکار کردن وفەرمووی: { أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ } - ئایا ئەگەر وەفاتی کرد یان کوژراو شەهید بوو، ئێوە پاشگەز دەبنەوە و هەڵدەگەڕێنەوە؟! - واتە چۆن هەڵگەڕێنەوەو دوای مردن وکوژرانی واز لە دینەکەی بێنن لە کاتێکدا ئێوە دەزانن کە پەیامبەران دەگوزەرێن‌و ئەگەر بە مردن وکوژرانەوە نەمان شوێنکەوتووانیان دەست بە دینەکەیانەوە دەگرن، کە دەفەرموێت: {وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ} - خۆ ئەوەی هەڵگەڕێتەوە و پاشگەزبێتەوە - واتە پشت لە شەڕ بکات یا ئەوەتا لە ئیسلامەکەی هەڵگەڕێتەوە، ئەوە هیچ زەرەرێك بە خوای پەروەردگار ناگەیەنێت‌و بەڵکو خۆی زەرەرمەند دەبێ، {وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ} - لە داهاتویەکی نزیکدا خوای گەورە پاداشتی سوپاسگوزاران دەداتەوە - واتە ئەو کەسانەی سەبریان گرت وشەڕیان کرد وشەهید بوون، چونکە بەو کارەیان سوپاسگوزای ئەو نیعمەتەی خوای پەروەردگاریان کرد کە بە موسوڵمانی قەراردابوون‌و، هەر کەسێك فەرمانی پەروەردگاری بێنێتە جێ ئەوە شوکری ئەو نیعمەتەی کردووە کە خوای پەروەردگار پێی بەخشیوە).

نووسەری "العجاب فی بیان الأسباب" دەفەرمێ: (کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: { وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ } - محمد (صلى الله عليه وسلم) تەنها پێغەمبەرێك نەبووە وەفات بکات، بێگومان پێغەمبەرانی پێش ئەمیش (وەفاتیان کردووە) - ئیمامی "طَبَري" لە ڕێی "سعيد بن أبي عروبة"و لە ڕێی "الربيع بن أَنَس"ەوە دەگێڕێتەوە کە دەفەرموون: کاتێك کە خەڵك لە ڕۆژی ئوحود دا پەیامبەریان لێ گوم بوو وهەواڵی مردنیان پێ گەیشت، خەڵکانێك وتیان: گەر پەیامبەر با نەدەکوژراو، خەڵکێکی تر وتیان: شەڕ لەسەر ئەوە بکەن کە پەیامبەرەکەتان شەڕی لەسەر ئەکرد تا ئەوەی خوای پەروەردگار سەرتان دەخات‌و یا ئەوەتا بەو دەگەنەوە، ئیتر خوای پەروەردگار ئەو ئایەتەی دابەزاند. "الربيع" - ڕەحمەتی خوای لێبێ - بە زیادەوە دەگێڕێتەوە کە یەکێك لە موهاجیران بەسەر کابرایەکی ئەنساردا تێدەپەڕێ خەڵتانی خوێنی بووەو ودەفەرمێ: فلان؛ هەستت بەوە کرد کە محمد

- صلى الله عليه وسلم - کوژراوە ؟ ئەنسارییەکە دەفەرمێ: ئەگەر محمد کوژرابێ ئەوە پەیامی خۆی گەیاند، ئیتر شەڕ لەسەر ئەو دینەتان بکەن، بۆیە ئەو ئایەتە هاتە خوار.

"السدّي" لە ڕێی "أسباط"ەوە دەگێڕێتەوە کە لە ڕۆژی ئوحود دا ... ئیتر بەسەرهاتەکە دێنێتەوەو لەوێدا دەفەرمێ: خەڵك ئەوەیان لە ناودا بڵاو بۆوە کە محمد - صلى الله عليه وسلم - کوژراوە، جا لەوێ بڕێك گوتیان: خۆزگە پەیامێکمان هەناردەی "عبدالله بن أُبَيّ" بکردایە ئەمانێکمان لە ئەبو سوفیانەوە بۆ وەرگرێ ! خەڵکینە بگەڕێنەوە نێو کەسوکاری خۆتان پێش ئەوەی بکوژرێن، "أنس بن النَّضْر" لەوێ فەرمووی: ئەگەر محمد کوژرابێ خواکەی محمد نەکوژراوە، ئیتر شەڕ لەسەر دینەکەتان بکەن، وپەیامبەریش - صلى الله عليه وسلم - بەڕێکەوت تا بە بەردێك گەیشت وخەڵکی بە دەوریدا کۆبوونەوەو ئەو ئایەتە لە باسی ئەو کەسانەدا دابەزی کە وتیان محمد کوژرا: {وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ ...}.

"القاسم بن عبدالرحمن بن رافع الأنصاري" کە لە "بَنِي عَديّ بن النَّجَّار"ە لە ڕێی "إسحاق"ەوە بۆی گێڕامەوە کە: "أَنَس بن النَّضْر" خۆی بە لای کۆمەڵە موهاجیر وئەنسارییەك دا دەستیان لە چەك بەردابوو وفەرمووی؛ ئەوە بۆ دانیشتوون ؟ وتیان؛ پەیامبەری خوا کوژراوە، أنس فەرمووی: دەی ژیانتان بۆ چییە لە پاش ئەودا، هەستن لەسەر ئەوە بمرن کە لەسەریدا مرد، پاشان ڕووی لە دوژمن کرد وشەڕی کرد تاوەکو کوژرا). قسەکانی کۆتاییان پێهات ڕەحمەتی خوای لێبێ.

قسەو باسی ئەهلی تەفسیریش دەربارەی هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە زۆرن‌و باسێکی زۆری لە بارەدا کراوە، گەر بیخەینە ڕوو باسەکەمان درێژە دەکێشێ. بەڵام ئەوەی لە قسەکانی پێشوویان وەریگرین ئەوەیە کە؛ ئەو کەسانەی لە ڕۆژی ئوحود دا لەگەڵ پێغەمبەر بوون - صلى الله عليه وسلم - وهەواڵی کوژرانییان بیست لە نێوان دوو پەیڕەو

ومەنهەج دا بوون، خەڵكانێكی خاوەن مەنهەجێكی نارێك ونابەجێ‌و، خەڵكانێكی خاوەن پەیڕەو ومەنهەجێكی دروست وڕاست وڕێكوپوێك .. هەرچی ئەوانەی خاوەن مەنهەجە گومڕاكە بوون ئەوانە بوون كە خوای پەروەردگار لە ئایەتەكەدا ئاگاداریان دەكاتەوەو خەڵكی لەو پەیڕەوە نابەجێیەیان ئاگاداردەكاتەوە، كە بەستنەوەی كار وكردارە بە كەسێكی تایبەتەوە با ئەو كەسەش پەیامبەری خوای بێ - صلى الله علیه وسلم. خاوەن ئەو پەیڕەوە نابەجێیەش دوو كۆمەڵ بوون؛ بەشێكیان خاو بوونەوەو بە هۆی شۆكی ڕووداوەكە تۆقین ودەستیان لە كار بەردا، بەو ڕادەی كە بیریان لەوە كردەوە لە كوشتن سەلامەت بن وئەمان لە كافران وەرگرن‌و، كۆمەڵێكی تری خاوەن ئەو پەیڕەوە نابەجێیە لە گومڕاییەكی توندتردا بوون وقەناعەتیان بە كوفر هێناو وڕاشكاوانە دەریان بڕی‌و، ئەو كەسانە بوون كە وتیان گەر پەیامبەر با نەدەكوژرا، یا ئەوانەی گوتیان بگەڕێنەوە سەر دینەكەی پێشووتان بەر لەوەی بكوژرێن.

گوتەی ئەو دوو كۆمەڵە خاوەن ئەو پەیڕەوە نابەجێیەش گوتەی زۆرێك لە موسوڵمانانی ئەمڕۆیە، كە لە ڕۆژنامەو گۆڤار وكەناڵەكاندا پڕ بە دەم هاوار دەكەن‌و دەڵێن؛ ئەگەر جیهادەكەی تاڵیبان وئەو عەرەبانەی لەگەڵیان بوون حەق بووایە لە شارەكان وەدەر نەدەنران ونەدەشكان‌و، كۆمەڵێكی تریان كە دەڵێن؛ وا باشترە (ئەفغانە عەرەبەكان) دەست بخەنەوە دەست حوكمەتەكانیان بۆ ئەوەی لەو تەنگژەیە دەربازیان بێت. جا بزانە ئەمڕۆ ودوێنێ چەند لێكدەچن، ئەو خەڵكەی شكانی سەربازییان كردە بەڵگەی پووچ بوونەوەی دینەكەی محمد - صلى الله علیه وسلم - وكاتێك هەواڵی كوژرانییان بیست پەیامەكەیان ڕەتكردەوە لە كاتێكدا لە مەیداندا لەگەڵی بوون ودەستیان لە شەڕدا بوو، ئەو پەیڕەوەش ئەمڕۆ زۆر بە ڕوونی لە لایەن گومڕایان دووپات دەكرێتەوە كە شكانی سەربازی بە بەڵگەی گومڕایی پەیڕەوی تاڵیبان وموجاهیدان دەناسێنن، بۆیە مێژوو خۆی دووبارە دەكاتەوەو، گومڕایان لە هەر خراپە ونابەجێیەكدا پێشینێكیان هەیە پێشتر لەسەری بووبن.

بەڵام ئەهلی ڕێنموونی ودینی حەق وخاوەن مەنهەجە ڕاست ودروستەکەی دووەمی کاتی شەڕەکە کە ئەهلی تەفسیر بۆمانی باس دەکەن، ئەوانەی بە وتەکانی ئەنەسی کوڕی نەضر وەڵامی هەواڵی کوژرانی پەیامبەریان دایەوە - صلی الله علیه وسلم - کاتێك کە بەسەر کۆمەڵە موهاجیر وئەنسارییەکەدا تێپەڕی کە دەستیان لە شەڕ بەردابوو وفەرمووی؛ ئەوە چییە دانیشتوون ؟ وتیان: پێغەمبەری خوا کوژراوە، پێی فەرموون: دەی ژیانتان بۆ چییە لە پاش ئەو، هەستن لەسەر ئەوەدا بمرن کە لەسەریا مرد، پاشان ڕووی لە دوژمن کرد وشەڕی کرد تا ئەو کاتەی کە کوژرا. ئەم مەنهەجە دروست وڕێکوپێکە لە هەڵوێستی ئەبو بەکری صدیق دا خۆی دەنواند - ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ - کاتێك کە لە مردنی پەیامبەردا - صلی الله علیه وسلم - فەرمووی: هەر کەس محمدی دەپەرست ئەوە محمد مرد وهەر کەس خوای دەپەرست ئەوە خوا زیندووەو قەت نامرێ. ئەم مەنهەجە دروست وڕێکوپێکەی عەلی کوڕی ئەبو تالیب دەینوێنێ - ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ - کاتێك گوتەی خوای پەروەردگار دەخوێنێتەوە کە دەفەرموێت: {وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ} - محمد (صلی الله علیه وسلم) تەنها پێغەمبەرێك نەبووە وەفات بکات، بێگومان پێغەمبەرانی پێش ئەمیش (وەفاتیان کردووە) - ودەفەرمێ: کە خوای پەروەردگار هیدایەتی داوین وڕێنموونی کردووین قەسەم بە خوا جارێکی دی هەڵناگەڕێینەوە، گەر بمرێتو یا بکوژرێ قەسەم بە خوا تا دەمرم شەڕی لەسەر دەکەم. ئا ئەمەش مەنهەجو پەیڕەوی تەواوی هاوەڵانی پەیامبەر بوو - ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێ - کە خوای پەروەردگاریان بە حەق دەپەرستو، لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەریش دا - صلی الله علیه وسلم - لەسەر ئەو ڕێبازە بەردەوام بوون وکۆڵیان لە جیهاد وبانگەواز وعیبادەت نەداو بەڵکو ئەو ڕێبازەیان گرتە بەر کە پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - لەسەری پەروەردە کردبوون، بۆیە هەر کاتێك شکانیان بەسەردا هاتبا ئایەتی خوای پەروەردگاریان دەهاتە بەرچاو کە دەفەرموێت: {وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ} - کۆڵ مەدەن و ساردمەبنەوە و خەفەت مەخۆن، چونکە هەر ئێوە سەربەرزو سەرفرازو سەرکەوتووترن ئەگەر ئیمانداری چاك و ڕاست و دروست بن - هەروەها کە دەفەرموێت: {أَوَلَمَّا أَصَابَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُم مِّثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّىٰ هَٰذَا ۖ قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنفُسِكُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ} - ئایا کاتێك بەڵاو

ناخۆشیەکتان تووشهات (لە جەنگی ئوحود)دا بۆ دەڵێن: ئەمە چی بوو؟ بۆ وامان بەسەر هات؟ لەکوێوە ئەمەمان بۆهات؟ (ئەی بۆ لەیادیان چوو، خۆ لەجەنگی بەدردا) بەڕاستی ئێوە دووئەوەندەتان بەوان کرد؟! ئینجا پێیان بڵێ: ئەو بەڵایە لەلایەن خۆتانەوە توشتان هات (کاتێك نافەرمانی پێغەمبەرتان کردو تەماعی دنیا لە دەروونتاندا جووڵا) بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە -، کە سەریش دەکەوتن ئەو ئایەتەی خوای پەروەردگاریان دەهاتە بەرچاو کە دەفەرموێت: {وَاذْكُرُوا إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ فِي الْأَرْضِ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ النَّاسُ فَآوَاكُمْ وَأَيَّدَكُم بِنَصْرِهِ وَرَزَقَكُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ} - یادی ئەوکاتە بکەنەوە کە ئێوە زۆر کەم و لاوازکراوو بێ هێزبوون لەزەویدا، دەترسان کە خەڵکی بتانرفێنن (بتانکوژن یان ئازارتان بدەن) جا خوای بالادەست جێ و ڕێی بۆ سازکردن و بەهێزی کردن بەسەرکەوتن و یارمەتی خۆی و لە ڕزق و ڕۆزیی و نازو نیعمەتە پاکەکان بەهرەوەری کردن بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بکەن -، ئەمە ئەو مەنهەجەیە کە خوای پەروەردگار پێی خۆشە لەسەری بین ولێی ڕازییە، کار وکردارمان بە بەڵگەی شەرعییەوە پەیوەست بێتو، بە ئەنجامەکان حوکم لەسەر کار وکردار نەدەین ئاخۆ دروستن یا چەوت، بەڵکو حوکمی هەر پرسێك پێویستە لەسەر بەڵگەی شەرعی کتێب وسوننەتەوە دامەزرابێتو، هەر کەسێك بیەوێ لە ڕێی ئەنجامەکانەوە حوکم لەسەر شەڕ وململانێکان بدات، ئەوە بە پێی ئەو پێوەرەوە پێویستە بڵێ شەڕی ئوحود چەوت بوو وپێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - لەوێدا نەیپێکا ! چونکە لەو شەڕەدا شکاو شکانیش لە لای ئەهلی ترس ونەفامیدا بەڵگەی چەوتی پەیڕەو ومەنهەجە.

بۆیە خاوەن ئەو پەیڕەوە گومڕایەی پەیامبەرێتی پێغەمبەریان ڕەتدایەوە - صلى الله عليه وسلم - وله دروست بوونی ئەو دینە پاشگەز بوونەوە ئەو کەسانە بوون کە دینیان بە کەس وتاك وجیهادیان بە هێماو ڕەمزەکانەوە بەستایەوەو، ئەو پەیڕەوەیان بەو فەساد وخراپە گەورەی گەیاندن کاتێك کە بە پێی چەوتی ئەنجام وشکستیانەوە پێشەکییەکانیان ڕەت کردەوە. هەر کاتێکیش مرۆڤ بەو پەیڕەوە گەیشت ئەوە بێگومان بە کوفر وياخود بە نائومێدی ورەشبینییەوە دەگاتو، ئەمەش مەنهەجی زۆر لە نەفامانی ئەمرۆیە، کە نە

شەرمیان لە خوای پەروەردگار ونە لە بەندەکانی هەیەو، بۆیە دەبینی لە هەر ڕووداوێکدا قسەیەکی پێچەوانەی قسەی دوێنێیان هەیە، هەر کات سەرکەوتنیان بینی بە شان وباڵی ئەو خەڵکە هەڵدەدەن وبەوپەڕی ئاسمانیان دەگەینن،و، کە شکست وشکان وتاقیکردنەوەیەکی خوای پەروەردگار دووچاری بەندەکانی بۆوە خەڵکەکە بە گومڕا وئەهلی بیدعە لە قەڵەم دەدەن ودەست بە ڕەخنەو تانەو تەشەر وجنێو وقسەی نابەجێ دەکەن. لەوانەشە ئەو شکستەی دووچاری موجاهیدان دەبێتەوە حیکمەتێکی خوای پەروەردگار بێ کە ڕیزەکانیان پاکبنەوەو دواتریش ڕیزی ئەو کەسانە پاکبێتەوە کە خۆیان پێ هەڵدەواسن ونسبەتی خۆیان بە موجاهیدان دەدەن ولە واقیعدا دەرکەون، بۆیە خوای پەروەردگاریش بە وردی شێواز و وەسفەکانیان دەردەخات کە دەفەرموێت: {وَإِنَّ مِنكُمْ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ فَإِنْ أَصَابَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَالَ قَدْ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيَّ إِذْ لَمْ أَكُن مَّعَهُمْ شَهِيدًا ، وَلَئِنْ أَصَابَكُمْ فَضْلٌ مِّنَ اللَّهِ لَيَقُولَنَّ كَأَن لَّمْ تَكُن بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ مَوَدَّةٌ يَا لَيْتَنِي كُنتُ مَعَهُمْ فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا} - سوێند بێت (دەستەیەك دووڕوو هەن) لەناوتاندا بەڕاستی خۆیان دەخلافێنن و سستی دەکەن، جا ئەگەر بەلایەکتان تووش بێت (هەریەك لەوانە) دەڵێت: بەڕاستی خوا چاکی بۆ کردم کە لەگەڵ ئەواندا ئامادەی (ئەو جەنگە) نەبووم، ئەگەر فەزڵ و دەستکەوتێکتان لەخواوە دەستکەوت بەڕاشکاوی دەڵێت ـ هەر وەك لەنێوان ئێوە و ئەو جۆرە کەسانەدا دۆستایەتی و ئاشنایەتی نەبوو بێت ـ خۆزگە لەگەڵ ئەواندا بوومایە و بۆ ئەوەی دەستکەوتێکی چاك و زۆر و زەبەندەم بەدەست بهێنایە - هەروەها خوای پەروەردگار باسیان دەکات وشێوازە بۆگەنەکانیان ئاشکرا دەکات ودەفەرموێت: {الَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ اللَّهِ قَالُوا أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ وَإِن كَانَ لِلْكَافِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوا أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ ۚ فَاللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۗ وَلَن يَجْعَلَ اللَّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا} - ئەوانەی کە خۆیان بۆ ئێوە مەلاسداوە چاوەڕوانی بەسەرهاتتان دەکەن، ئەگەر سەرکەوتنێکتان لەلایەن خواوە دەست بکەوێت دەڵێن: ئەی ئێمە لەگەڵتاندا نەبووین؟! خۆ ئەگەر کافرەکان بەشێکیان ببێت لە سەرکەوتن، دووڕووەکان دەڵێن: ئایا ئێمە لەسەر ئێوەمان نەدەکردەوە و، نەمانهێشت ئیمانداران زیانتان پێبگەیەنن، ئینجا خوا لە ڕۆژی قیامەتدا دادوەریی دەکات لە نێوانتاندا ودڵنیابن هەرگیز خوا نایەڵێت بێ باوەڕان بەسەر ئیمانداراندا دەست ڕۆیشتوو بن و

ڕیشەکەنیان بکەن -، بەڵێ چونکە عیبادەتی جیهاد تەنها خەڵك وخاوەنی خۆی دەیگەیەنـنە جێو، سەرکەوتن ورزگاری وتەمکینیش دەشت ودۆڵی زۆری لە پێشە مرۆڤ پێی بگاتو، ئەمڕۆش ئەم عیبادەتە تەنها ئەو کەسانە پشتیوانی دەکەن کە خۆیان بۆ بەڵاو فیتنەو ناخۆشی وتاقیکردنەوە ئامادە کردووە. کەچی ئەوانەی لەسەر پەیڕەوێکی شلگرتوون وکەس نازانێ ئاخۆ پشتی جیهادیان گرتووە یا پێچەوانەو بەرهەڵستین، ئەوە خوای پەروەردگار خۆی لەو ئایەتانەداو لە سوورەتی تەوبە فرت وفێڵە شەیتانییەکانی ئاشکرا کردوونو پەردەی لەسەر پەیڕەوە گومڕاکانیان هەڵداوەتەوە.

بەستنەوەی جیهاد وجەنگ بە کەسانێکی تایبەتەوە مرۆڤ تەنها بە شکستی بێ گومانەوە دەگەیەنێت، تەنانەت گەر شکستێکی مادیش نەبێ لە مەیدان دا شکستێکی مەعنەوییە کە لە ساردبوونەوەی مرۆڤ لە جیهادەوە دەردەکەوێت، کاتێك کە موسوڵمانان ئەو سەرکردایەتییان لە دەست دەچێ کە پێیان وابوو بێ لەو سەرکردایەتییە ناکرێ سەرکەون وبە ئامانج بگەن، بۆیە هەڵەیە خەڵك خۆیان بە کەس وسەرکردەوە پەیوەستکەنو، پێویستە عیبادەتی جیهاد کردن لە پەیوەست بوونیەوە بە ڕەمز وهێماوە ئازادکرێت، بەڵێ پێویستمان بە سەرکردایەتییەك هەیە موجاهیدانی پێوە ببەسترێتەوە وپێویستمان بە سەرکردایەتییەك هەیە نەخشە دارێژێت وکاروبار بباتە ڕێ، بەڵام نەمانی سەرکردایەتی مانای ئەوە نییە پەیوەندی نێوان موسوڵمانان وجیهاد بشکێتو، هەر وەك چۆن گۆڕەپانەکانی جیهاد سەرکردایەتی لەو ئاستەیان دایە دەر ئەوە بەردەوام دەبن وسەرکردەی تریش پێدەگەینو، مێژووش شایەتە کە هیچ سەردەمێك لە دوای پەیامبەرەوە نەبوو شێرەپیاوی تیا نەبێ بەرگری لەم دینە بکەن، بەو ڕادەی هەر کەس باسیانی بیستبێ وا خەیاڵی کردووە کەسی وا پێشتر لەم ئوممەتەدا نەبووە، ئافرەتی موسوڵمانانیش قەت نەزۆك نەبوونە کەسانی وەك عومر وخالید ومیقداد وعیکریمە وسەلاحەدین وقُطُز بەم ئوممەتە ببەخشن، ئەم ئوممەتەش وەك باران وایە، نازانرێ ئاخۆ خێری لە سەرەتاکەیتی یا لە کۆتاییەکەی.

کوشتنی سەرکردەش لای ئەو مسوڵمانانەی بەو پەیڕەوە پەروەردە بوونە کە جیهاد بە ڕەمز وهێماوە نەبەستنەوە؛ سووڕتریان دەکات لەسەر بنەماو ڕێبازەکەیان، چونکە ئەوان خواو پەروەردگاری ئەو جیهاد دەپەرستن نەك سەرکردایەتی جیهادەکەو، سەرکردەکانیش لە خاکی جەنگدانو وەکو هەر سەربازێك لە شەڕەکەدا دووچاری کوشتنن، بەڵکو سەرکردەکان بە دوای شەهید بووندا دەگەڕێن وچاوەڕێی ئەو ڕۆژەن بە حۆرییەکان بگەن وچاویان بە بینینی خوای پەروەردگار شاد بێتو، تەواویان پەرۆشی ئەو ڕۆژەن وکاری بۆ دەکەن وئاواتی پێ دەخوازن.

بۆیە کە سەرکردەکان بە ئاواتی خۆیان دەگەن وەك ئەوەی مەلا عومەر یا شێخ ئوسامە یا فەرماندە شامل باساییف ویا خطاب وسەرکردەی تری جیهاد لە هەر شوێنێکدا بکوژرێن، ئەوە گەیشتنیان بەو ئاواتەی دەیانخواست وداوایان لە خوای پەروەردگار دەکرد پێی بگەن سەرکەوتنی کەسی خۆیانە، بەڵام جیهادەکە ون نابێت، چونکە جیهاد عیبادەتێکە خوای پەروەردگار خۆی کەفالەتی ئەوەی کردووە تا ڕۆژی قیامەت بەردەوام بێو، وبەڵێنی خوای پەروەردگار کە بەندەکانی خۆی لەو کاتەدا سەرخات کە مەرجەکانی سەرکەوتن لە خۆیاندا بێننەجێ چ سەرکردەکانیان لەگەڵیان بن وچ لە پێناو خوای پەروەردگاردا بکوژرێن لە کاتی خۆیدا دێتە جێ، بۆیە شایەنی ئەوەیە کە جیهاد بە کەس وجەنگ بە ڕەمز وهێماوە نەبەستینەوەو، وەك شیخ سلیمان أبو غیث لە وتارێکدا بەر لە چەند ڕۆژێ دەڵێت: (گەر ئوسامە کوژرا ئەوە هەزار ئوسامە ئاڵاکەی لە دوادا هەڵدەگرن)، وشێخ ئوسامەش بۆ خۆی لە یەکێك لە چاوپێکەوتنە ڤیدیۆکاندا کاتێك کە پرسیار لە بارەی ئەگەری پەرتەواز بوونی قاعیدەو ئەفغانە عەرەبەکانی لێ دەکەن گەر هات وئەو تیرۆرکرا، دەفەرمێ: (تیرۆرکردنم بە شەهادەتی دەزانم لە پێناو خوای پەرورەدگار وهەر ئەوەش بوو کە ئاواتم پێی دەخواست وداوا لە خوای پەروەردگار دەکەم شەهیدیم پێ ببەخشێ، ئوسامەش تەنها تاکێکە لە ڕۆڵەکانی ئەم ئوممەتەو، ئوممەتیش پیاوی زۆری تیایە ئامادەی فیداکردنی خۆیان بن وهەرچی هەیانبێ لە پێناو ئەم دینەدا، بۆیە ئوسامە تاکێك نییە بەڵکو مەنهەجێکە تەواوی ڕۆڵەکانی ئوممەت بڕوایان پێیەتی).

لە کۆتاشدا تەواوی موسوڵمانان لەوە ئاگادار دەکەینەوە کە جیهاد بە کۆمەڵە هێمایەك وشەڕەکە بە چەند کەسێکەوە ببەستنەوە، چونکە ئەم پەیڕەوە پەیڕەوێکی گومڕا وشەڕ وخراپەیەوەکی یەکجار گەورەیە هەم دین وهەم دونیاش بە فەساد دەگەینێت‌و، جیهادیش عیبادەتێکە بۆ خوای پەروەردگارو، یەکێك لە نەگۆڕەکانمان ئەوەیە کە جیهاد تا ڕۆژی قیامەت بەردەوامەو، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کۆچی دوایی کرد وپەیڕەوی هاوەڵانی پەیامبەر لە جیهاد کردندا نەگۆڕاو بەڵکو فەتحەکانیان زیاتر بوون‌و، ئەبو بەکر - ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ - کۆچی دوایی کرد ودەوڵەتی ئیسلام بەرفراوانتر بوو وجیهاد کاریگەر نەبوو، وعومەر - ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ - کۆچی دوایی کرد وموسوڵمانان ئەوەندەی تر بە زەویدا بڵاوبوونەوەو، موسوڵمانانیش نەوە لە دوای نەوە هەر وا بوون‌و، هەر وەك یەکێك لە نەگۆڕەکانمان ئەوەیە کە جیهاد بنەماو عیبادەتێکی مەزنەو نە بە نەمانی کەس ونە بە نەمانی سەرکردەش ناهەژێت‌و گۆڕانی بەسەردا نایەت، داواکارین لە خوای پەروەردگار کە ڕێنموونیمان بکات وئوممەتمان بەرز وشەکاوە بێڵێتەوەو بەسەر تەواوی میللەتانی کوفردا سەربەرز وسەرفرازیکات، خوای پەروەردگار خۆی خاوەنییەتی وقودرەتی بەجێگەیاندنی هەیە.



**پێگەی ئیسلامی گزنگ**

Facebook:- @Gizing.net

Telegram:- @GizingNet

١٤٣٨ - ٢٠١٧